ڕوهبانی شەو و سوارچاکی ڕۆژ، ئەوانیش: {دەستەیەك لەوانە زوو وەڵامی بانگەوازی الله یان داوە وە دەستەیەکی تریش درەنگ وەڵامیان داوە} [الواقعة: ١٣-١٤].

وە هەندێك لە شاهیدەکانی وتەکانی ئەهلی زمان دەهێنینەوە بە هەندێك فەرمودەی لاواز، لەوانە: (جیهاد بکە، جیهاد ڕەهبانیەتی ئیسلامە) [رواه أحمد عن أبي سعيد الخدري]، و(بۆ هەموو پێغەمبەرێك ڕەهبانیەت هەیە، و ڕەهبانیەتی ئەم نەتەوەیە جیهادە لە ڕێگەی الله) [رواه أحمد عن أنس].

و(جیهاد بکە بەڕاستی ئەوە ڕەهبانیەتی نەتەوەکەمە) [رواه ابن حبّان عن أبي ذر].

وە لەوانە: فەرموودەیەك لە گێڕانەوەی عثمان کوڕی مظعون، کە هاتە لای پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- و گوتی: «ڕێگەم پێبدە کە شەهوەتی خۆم ببڕم»؛ ڕەسول الله فەرموی، صلى الله عليه وسلم: (لە ئێمە نیە ئەوەی ئەو کارە بکات، یان بۆ یەکێکی تری بکات، بڕینی شەهوەت و ئارەزوی نەتەوەکەم بریتیە لە ڕۆژوو)؛ گوتی: «ئەی پێغەمبەر، ڕێگام پێبدە کە گەشت بکەم »؛ فەرمووی: (بەڕاستی گەشتی نەتەوەکەم جیهادکردنە لەڕێگای الله)؛ گوتی: «ئەی پێغەمبەر، ڕێگای بەندایەتی الله و دورکەوتنەوە لە خەڵکم پێبدە»؛ فەرمووی: (بەندایەتی و دورگرتنی نەتەوەکەم دانیشتنە لە مزگەوت بۆ چاوەڕوانی نوێژ) [رواه ابن المبارك في الزهد بإسناد ضعيف].

وە لەوانە: (لا سياحة، ولا تبتّل، ولا ترهّب في الإسلام) [رواه عبد الرزاق عن طاووس مرسلا].

ئیبن قوتەیبە گوتی: «گوتەی (ولا رهبانية) مەبەست پێی کرداری ڕەهبانەکانە لە بەردەوامی ڕۆژوو و لەبەرکردنی جلی تایبەت و نەخواردنی گۆشت و شێوەکانی... وە گوتەی (ولا تبتّل) مەبەست وازهێنانە لە ژن هێنان» [غريب الحديث].

وە ئیبن ئەنباری دەڵێت: «[راهب متبتّل]: دابڕاوە بۆ الله -تبارك وتعالى- و واز لە ژن هێنان بهێنێت»، پاش باسکردنی فەرموودەی تاوس، پاشان گوتی: «الرهبانية: خو گرتنە بە سایلۆکان، و واز هێنان لە خواردنی گۆشت» [الزاهر].

وە هەندێك شاهیدی پێشەواکانی زمان دەهێنینەوە بە هەندێك ئاثاری وەستا و و دابڕاو، لەوانە: «گەشتی نەتەوەکەم ڕۆژووگرتنە» [رواه الطبري عن عائشة]، و«{السَّائِحُونَ}: ڕۆژووگران»، و«{سَائِحَاتٍ}: ڕۆژووگرە ئافرەتەکان» [رواهما الطبري عن عدد من السلف].

ئیبن قوتەیبیە گوتی: «گەشت لە بنەڕەتدا واتە: ڕۆیشتن لەسەر زەوی... وە کەسی گەشتکەر دوردەکەوێتەوە لە ژن هێنان، بۆیە نمونەی وەك ڕۆژووگرە، لەبەر ئەوەی خۆی دەگرێت لە خواردن و خواردنەوە و نزیك کەوتنەوە لە ئافرەت» [غريب القرآن].

وە تەبەری لە ڕاڤەکەی دەڵێت: «هەندێك لە ئەهلی زمانی عەرەبی دەیانگوت: وادەبینین کە ڕۆژوگر ناونراوە لە گەشت کەرەوە لەبەر ئەوەی ئەوەی گەشت دەکات هەرکاتێك کە خواردنی دۆزیەوە دەیخوات، وەك بڵێی لەوەوە وەرگیراوە».

وە لەوانە: لە سوفیانی کوڕی عەیینەوە کە گوتی: «عەمر پێی گوتین، کە گوێی لە وەهبی کوڕی مونەبەه بوە دەیگوت: گەشت لە نەوەی ئیسرائیل بریتی بوو...» کوڕی عەیین گوتی: «ئەگەر وازی لە خواردن و خواردنەوە هێنا ئەوە گەشتکەرە (سائح)» [رواه الطبري].

وە المروزي، بەڕەحمەت بێت (کۆچی کردوە لە ٢٩٤ ك) گوتی: «لە ئیسحاق کوڕی سوەیدەوە [کە تابیعیە، کۆچی دوای کرد لە ١٣١ ك]: ئەوان [پێشینی چاك] سیاحەت بە ڕۆژوبوونی ڕۆژوو و شەونوێژی شەو دادەنێن» [مختصر قيام الليل].

وە دوای ئەوە، دیار و ئاشکرایە و گومانی تێدا نیە کە مەبەست لە (گەشتی نەتەوەکەم جیهادە)، دورکەوتنەوەیە لە گەشتی ڕوهبانە بیدعەچیەکان لەگەڵ ئەو بانگەشە پوچانەی کە دەکرێت کە دەڵێن پشت دەبەستین بە الله و پشت لە دونیا دەکەن لەکاتێك دا کە هیچ خواردن لەگەڵ خۆیان نابەن و پشت لە هاوسەرگیری دەکەن -ئەوەش نەریتێکە کەهەندێك لە تەریقەتەکانی صۆفیەت بەمیرات وەریان گرتوە لەم کافرانەی کە خاوەنی پەرتوکی ئاسمانین- وە بەهەمان شێوە مەبەست لێی، ڕون کردنەوەی شتێکە کە باشتر بێت لە گەشت، ئەویش جیهاد لەڕێگای الله، کە بەندایەتی الله و هیواخواستنی دیداری الله ی تێدایە بۆ زانیاری کە پێشینەی چاك لە شوێنی گەشت: ئیعتیکافیان دەکرد لە مزگەوت و شەونوێژ و ڕۆژو و داواکردنی زانست، وە هەیانە دەڵێن هیجرەت کردنیان بە گەشت داناوە لەبەر ئەوەی بەردەوام لە قورئان لەگەڵ جیهاد هاتوە، عبدالرحمن کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم -ڕەحمەتی الله ی لەسەر- (کۆچ کردوی ١٨٢ ك) لە ڕاڤەی {السَّائِحُونَ} وە {سَائِحَاتٍ} گوتویەتی: «لە قورئان و لە نەتەوەی موحەممەد گەشت نیە جگە لە هیجرەت» [رواه الطبري]، وە گوتی: «ئەوان گەشتیان بریتی بوو لە هیجرەت کردن کاتێك هیجرەتیان کرد بۆ مەدینە» [رواه ابن أبي حاتم].

ئەوەی دەیەوێت لە ئەهلی گەشتکەرەکانی پێشینەی سوننە بێت، پێویستە لەسەری هیجرەت و جیهاد بکات، وە لەسەری واجبە کە جیهادی ئارەزووی بکات لە پابەند بوون بە پشت کردن لە دونیا و یادکردنی الله و سەنگەرگرتن و کوشتارکردن ئەوەندەی کە بتوانێت، و دورکەوتنەوە لە گوناه و تاوان بە ئاشکرا و نهێنی، وە لەوانە: خۆ بەگەورەزانین و غەیبەت کردن و نەمیمەت کردن و کوشتارکردن و قۆستنەوەی کاتەکان بەویرد.

وە لە کۆتایی، ئیبن قەیم -ڕەحمەتی الله ی لەسەر- لە ڕاڤەی فەرموودەی الله گوتی {بەڕاستی الله گیان و ماڵی لە باوەڕداران کڕیوەتەوە بەرامبەر بە بەهەشت ئەوانەی کە دەجەنگن لە پێناو الله و دەکوژن و دەشکوژرێن ئەوە بەڵێنێکە لە تەوڕات و ئینجیل و قورئان وە کێ لە الله بە وەفا ترە کەواتە دڵخۆش و کامەران بن بەم کڕین و فرۆشتنە بەڕاستی ئەوە سەرکەوتنێکی گەورەیە، سوپاسگوزاران و گەڕۆکەکان...} ئایەتی [التوبة: ١١١-١١٢]: «سیاحەت بە ڕۆژوو گرتن ڕاڤە کراوە، وە ڕاڤە کراوە بە داواکردنی زانست، و ڕاڤەکراوە بە جیهاد، و ڕاڤە کراوە بە بەردەوامی عیبادەتکردن، وە ڕاستترینیان ئەوەیە کە گەشتی دڵ خۆی دەگرێتەوە لە ویردی الله، و خۆشەویستی، و ملکەچ بوون بۆی، و تەوبەکردن بۆلای، هیواخواستنی دیداری، ئەوانە هەمووی لەسەری جێبەجێ دەبێت، ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە الله کاتێك باسی خێزانەکانی پێغەمبەر دەکات -صلى الله عليه وسلم- دەفەرمووێت ئەوەی خێزانەکەی تەڵاق دەدات، ئەوە الله بۆی دەگۆڕێت بە ئافرەتێکی (سائحات)، وە سیاحەتی ئەوان جیهاد نیە، و گەڕان نیە بۆ زانست، و بەردەوامیش نیە بۆ ڕۆژوو، بەڵکو ئەوە گەشتی دڵەکانیانە لە خۆشەویستی الله، و ترسان لێی، و گەڕانەوە بۆی، و یادکردنی، وردبەوە چۆن الله تەوبە و عیبادەتی بەیەکەوە گرێداوە، تەوبە وازهێنانە لەوەی الله پێی ناخۆشە و عیبادەت کارێکە کە خۆشی دەوێت، وە سوپاس گوزاری و گەشتی بەیەکەوە هێناوە الله تعالی، یەکەمیان پیاهەڵدانە بە الله و باسکردنیەتی بە ئەوپەڕی تەواوی و وە گەشتی زمانە بە باشترین باسکردنی الله، وە ئەوە گەشتی دڵە لە خۆشەویستی و باسکردنی الله، هەروەك الله عیبادەت و گەشتی بەیەکەوە هێناوە لە باسی هاوسەرگیری، یەکیان عیبادەتی لاشەیە و ئەوەی تریش عیبادەتی دڵە» [حادي الأرواح].

الله زاناترە، وصلى الله وسلم على الرسول النبي الصادق الأمين، وعلى أزواجه وذريته الطيبين الطاهرين.

# ڕێچکەکانی

# سەرکەوتن

شێخ ئەبو حەمزەی موهاجیر (اللە لێی وەرگرتبێت)

بەشی 3




پێنجەم [لە ڕێچکەکانی سەرکەوتن]: ئامادەسازی.

اللّە تعالی دەفەرموێت: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ﴾ [الأنفال ٦٠]. خاوەنی «أضواء البيان» دەڵێت: «ئەوە فەرمانێکی پتەوە بە ئامادەکاری بەگوێرەی توانا هەرچەندە پێشکەوتن ڕوبدات لە هێز، ئەوە فەرمانێکی چەسپاوە بە ڕێکردن لەگەڵ پێشکەوتنەکان لە بواری دونیـا».

هەروەك زانراوە کە جیهاد ئەمڕۆ فەرزی عەینە لەسەر هەموو موسڵمانێك... ئەگەر واجبێك تەواو نەبێت ئیلا بە شتێك نەبێت ئەوە ئەو شتە دەبێت بەواجب، صلّے اللّە علیە وسلّم دەفەرموێت: ((بهاوێژن ئەی بەنی ئیسماعیل بەڕاستی باوکتان تیرهاوێژ بووە)) [بوخاری گێڕاویەتیەوە لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەع]. وە فەرمویەتی: ((بەڕاستی هێز هاوێشتنە)) [موسلیم گێڕاویەتیەوە لە عەقەبەی کوڕی عامر]، صەنعانی لە شەرحی فەرموودەکەی پێشوو دەڵێت: «فەرموودەکە ڕاڤەی هێز دەکات بە تیر هاوێشتن لەبەر ئەوەی لەسەردەمی پێغەمبەر(صلی اللە علیە وسلم) ئەوە هەبووە،وە هاوێشتن بە چەك دژی موشریك و دەرچووەکان لەڕێگا دەگرێتەوە» [سبل السلام]، کورتەی ووتەکان ئەوەیە کە ئامادەکاری بۆ جەنگی دامەزراو دژی خاچ پەرستان و مورتەددان واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێك کە جیهادی لەسەر واجبە.

وە لێرە دا پوختی دەکەمەوە:

یەکەم: ئەوەی کە أبو جعفرٍ الطبري -رحمە اللە- لە ڕاڤەکەی باسی کردوە لە ڕاڤەی ووتەی اللّە تعالی ﴿مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ﴾، دەڵێت: «ئەوەی کە لەتواناتان داهەیە بۆ ئامادەکاری لە ئامێر کە دەبێت بە هێز و چەك بۆتان» [جامع البيان].

دروستکردنی چەك گەورەترین یارمەتی دەرە بۆ جیهاد لەڕێگەی اللّە، ئەوەیە کە ئەمڕۆ ناسراوە بە دروستکردنی جەنگ، وە اللّە تعالی لە پەرتوکەکەی باسی ئەم دروستکردنەی کردوە لە چەندین شوێن، بەڵکو زۆر بە ورد و درێژتر باسی کردوە فەرمویەتی: ﴿وَعَلَّمْنَاهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَّكُمْ لِتُحْصِنَكُم مِّن بَأْسِكُمْ فَهَلْ أَنتُمْ شَاكِرُونَ﴾ [الأنبياء ٨٠]، تەبەری -رحمە اللە- دەڵێت: «داودمان فێری دروستکردنی لەبوس کرد بۆتان، اللّبوسُ لای عەرەب هەموو چەکێك دەگرێتەوە جا زرێ بێت یان قەڵغان یان شمشێر یان ڕم». وە ابن کثیر دەڵێت: «واتە دروستکردنی زرێ».

اللّە تعالی باسی سیفاتی زرێی کردوە و فەموویەتی: ﴿أَنِ اعْمَلْ سَابِغَاتٍ وَقَدِّرْ فِي السَّرْدِ﴾ [سبأ ١١]، واتە: زرێی درێژ و فراوان، ﴿وَقَدِّرْ فِي السَّرْدِ﴾ خاوەنی «أضواء البيان» دەڵێت: «واتە ئەڵقە و بزمار بەئەندازەی پێویست لە دروستکردنی زرێ بەکاربهێنن».

وە ابن کثیر لە قەتادەوە دەگێڕێتەوە کە: زرێی پێشو لە لەوح بوو داود -علیە السلام- یەکەم کەس بوو کە حەڵقەی پێوە خست.

ئەوەی پێشوو یارمەتیدانێکی اللّە بوو بۆ دروستکردنی زرێ تا اللّە باسی کرد بە وردی و درێژی و باسی پتەوی کرد بۆ بەندەکانی تا بزانێت ئایە ئێوە سوپاسگوزاری دەکەن؟ بەداخەوە زۆر لە موجاهیدەکان یان زۆربەیان گرنگی بە زرێ نادەن لە جەنگی دوژمن، وە سودی زۆری تێدایە گرنگترینیان پارێزگاری موجاهیدە لە گولەکانی دوژمن و پارچەکانی نارنجۆك کە موجاهید لامان بەرزترین شتە.

دووەم: پارێزگاری موجاهید لە بریندار‌بوونی لە شوێنە هەستیارەکانی کە وای لێدەکات نەتوانێت جیهاد بکات یان وای لێدەکات لە هۆش خۆی بچێت و لە گۆڕەپانی جەنگ بمێنێتەوە دوای برینداربوونی کە ئەگەری بەدیلکردنی هەیە لەلایەن دوژمن.

سێیەم: یارمەتی موجاهید دەدات بۆ گەیشتن بە نزیکترین شوێنی دوژمن، بە تایبەتی بۆ پاڵەوانانی هەڵکوتانە سەر و شێرە شەهادەت خوازەکان.

وە لە کۆتایی ئێمە لە ڕەسول اللّە -صلّے اللّە علیە وسلّم- ئاژاتر نین کە ئەو زرێ و جلی تایبەتی هەبوو (مغفر)، هەروەك شمشێری هەبوو، لە صەحیحی بوخاری هاتووە لە عائیشەوە اللّە تعالی لێی ڕازی بێت کە فەرموویەتی: «پێغەمبەر -صلّے اللّە علیە وسلّم- وەفاتی کرد

و زرێیەکەی بە بارمتە دانابوو لای جولەکەیەك بە سی مشت لە جۆ». وە لە پێغەمبەرەوە -صلّى الله عليه وسلّم- جێگیر بوە کە ئیمام ئەحمەد لە موسنەدەکەی و ئەبوداود گێڕاویانەتەوە کە لە ڕۆژی ئوحد دوو زرێی بەستابوو.

وە لە ئەنەسی کوڕی مالیك هەروەك لە هەردوو صەحیحەکە هاتوە کە پێغەمبەر -صلّى الله عليه وسلّم- چوە ناو مەککە لە ساڵی فەتح و جۆرێك لە زرێی لەسەری بەستابوو، یان خوذەی بەستابوو بە تێگەیشتنی سەردەم، الله ڕێگەی نیشانداوین بۆ قاڵبی ئاسن کە بنەڕەتی دروستکردنی هەموو چەکەکانی ئەمڕۆیە، پەروەردگار لە چیرۆکی ذو القرنين دا دەفەرمووێت: ﴿آتُونِي زُبَرَ الْحَدِيدِ حَتَّىٰ إِذَا سَاوَىٰ بَيْنَ الصَّدَفَيْنِ قَالَ انفُخُوا حَتَّىٰ إِذَا جَعَلَهُ نَارًا قَالَ آتُونِي أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا﴾ [الكهف ٩٦].

واتە پارچە ئاسنێکی گەورەم بۆ بهێنن وە فوی پێدا بکەن تا وەك ئاگری لێدێت لەبەر زۆر سوربوونەوەی و گڕەکەی پاشان گوتی: ﴿آتُونِي أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا﴾ واتە مسێکی تواوە، لەم سەردەمەیە ئەوە دۆزرایەوە کە تێکەڵکردنی برێك لە مس لەگەڵ ئاسان باشترین ڕێگایە بۆ پتەوکردنی ئاسن و زۆر بەرگری کردنی.

وە الله تعالى نوحی فێری دروستکردنی کەشتی کرد: ﴿وَاصْنَعِ الْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا﴾ [هود ٣٧]، تەبەری گێڕاویەتیەوە لە -ابن عەباسەوە- -الله لەهەردووکیان ڕازی بێت- کە گوتویەتی: «نوح نەیدەزانی چۆن کەشتی دروست بکات، الله نیگای بۆکرد کە کەشتی دروست بکات لەسەر شێوەی سنگی باڵدار».

وە پێغەمبەر -صلّى الله عليه وسلّم- مەدحی جەنگاوەرانی نەتەوەکەی کردوە کە دەجەنگن لەسەر کەشتی هەروەك لە فەرموودەی ئوم حەرام هاتوە الله لێی ڕازی بێت [بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە]، ئایە کەسی چاپوك هەیە بۆ ئەم پیشەسازیە؟ وە الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿فَأَتَى اللَّهُ بُنْيَانَهُم مِّنَ الْقَوَاعِدِ فَخَرَّ عَلَيْهِمُ السَّقْفُ مِن فَوْقِهِمْ﴾ [النحل ٢٦].

زانراوە لای هەموو ئەوانەی کە تێدەگەن لە دروستکردنی تەقەمەنی و بەکارهێنەرانی کە ئەم ئایەتە بەڕاستی بنەڕەتی زانستی خاپورکردنە بە تەقەمەنیەکان، ئەوەت بەسە کە لە پێغەمبەرەوە -صلّى الله عليه وسلّم- هاتوە کە ئەو کەسی هاننەداوە لەسەر پیشەسازی ئەوەندەی هانی پیشەسازی ئامێرەکانی جەنگی داوە کە صلّى الله عليه وسلّم دەفەرموێت: ((بە تیرێك سێ کەس دەچن بۆ بەهەشت؛ دروستکەرەکەی کە چاوەڕێی پاداشت بکات و ئەوەی دەیهاوێژێ، و ئەوەی تیردانەکە هەڵدەگرێت)) [هەر چوار خاوەنی سونەنەکە لە عەقبەی کوری عامرەوە گێڕاویانەتەوە]، چ جای ئەو کەسەی موشەك دروست دەکات یان فرۆکە دروست دەکات یان کەرەستەیەکی تەقەمەنی تایبەت دروست دەکات.

هەرچی ئامادەکاری ڕاگەیاندنە:

ئەمڕۆ جەنگی موجاهیدان لە دژی دوژمنانیان لە دوو قۆڵی گرنگ دەسوڕێتەوە، یەکەم قۆڵی سەربازی کە باسمان کرد، دووەم قۆڵی بەرەی ڕاگەیاندنی شەیتانیە کە ناسنامەی ئەم نەتەوەی بزرکردوە و بیروباوەڕیان و ئەخلاقیانی گۆڕیوە و توشی دۆڕانی دەرونی کردوون، بەڕاستی گەرمی قازیفەی ڕاگەیاندن زیاندەرتر و مەترسی گەورەترە لەسەر ئەم نەتەوەیە و پیاوەکانی لە تینی ئاگری موشەکی فرۆکەکان، بۆیە پێویستە موجاهیدان ئەوانەی الله تعالى سەریخستوون بۆ شکاندنی هێزی دوژمن لەڕێگەی سەربازێك ئەوا نەبەرد و چالاکیش بێت لە بەرەی ڕاگەیاندن، ڕەسول الله، -صلى الله عليه وسلم- دەفەرمووێت: ((جیهادی موشریکەکان بکەن بە زمانتان)) [ئەحمەد گێڕاویەتیەوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە].

وە صلّى الله عليه وسلّم فەرمویەتی: ((بەڕاستی باوەڕدار جیهاد دەکات بە شمشێر و بە زمانی، سوێند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە زمانەکانتان وەك تیرە لەکاتی هاوێشتندا)) [ئەحمەد گێڕاویەتیەوە لە کەعبی کوڕی مالیك].

-صلّى الله عليه وسلّم- بەدوای زیاترین هۆکارەکانی ڕاگەیاندن گەڕاوە لەسەردەمەکەی خۆی کە کاریگەرترن و توندترن لەسەر دڵی دوژمنان ئەویش شیعرە، ترمزی و نەسائی گێڕاویانەتەوە لە ئەنەسی کوڕی مالیك کە پێغەمبەر صلّى الله عليه وسلّم کاتێك چوە ناو مەککە لە کۆتا عەمرەیدا و عبدالله ی کوری ڕەواحە لەپێشی دەڕۆیشت و شیعری دەگوت.

عومەر گوتی: ئەی کوڕی ڕەواحە! لەپێش پێغەمبەر صلّى الله عليه وسلّم، و لە مزگەوتی حەرام شیعر دەڵێی؟ پێغەمبەر صلّى الله عليه وسلّم فەرمووی: ((عومەر لێی گەڕێ، ئەوە خێراترە لە تیر لەکاتی هاوێشتن)). هەروەك ڕەسول الله صلّى الله عليه وسلّم دڵی خۆش بوو بە ئیسلام بوونی خالید کە سەرکردەیەکی سەربازی بوو، بەهەمان شێوە دڵی خۆش بوو بە ئیسلام بوونی یەکێك لە شاعیرە گرنگ و بەناوبانگەکان، لە موسنەدی ئەحمەد دەڵێت کاتێك کۆمەڵێکی ئەنصار هاتن بۆ بەیعەتی عەقەبە بە عەباسی گوت: ((ئەم دوو پیاوە دەناسی؟)) کەڕوی سوڕاند گوتی بەڵێ ئەوە بەڕائی کوڕی مەعڕوڕە گەورەی گەلەکەیەتی و ئەوەش کەعبی کوڕی مالیکە، کەعب گوتی سوێند بە الله گوتەی ڕەسول الله -صلّى الله عليه وسلّم- لەبیرناکەم کە گوتی: ((شاعیرەکە؟)) گوتی بەڵێ [رواه أحمد].

وە گێڕاویانەتەوە لە ڕەسول الله -صلّى الله عليه وسلّم- لەسەر پێداگری لەسەر ئامادەکاری بۆ شیعر کاتێك بە حەسانی گوت: ((ئەبو بەکر بهێنن ئەو شارەزایە بە بە کەم و کورتی و ناشرینیەکانی گەلەکە ئەو زانایە بە ڕەچەڵەك)) [بەیهەقی هێناویەتیەوە لە بابی ڕەچەڵەك]، وە لە صەحیحی بوخاری دا هاتوە لە عائیشەوە -الله لێی ڕازی بێت- کە حەسان داوای ئیزنی کرد لە ڕەسول الله -صلّى الله عليه وسلّم- بۆ جوێندان بە موشریکەکان، گوتی ((سەبارەت بە ڕەچەڵەکی من چی؟))، حەسان گوتی: دورت دەخەمەوە لێیان چۆن مو دەردەهێندرێت لە هەویر. وە صلّى الله عليه وسلّم حەزی لە شیعر بوو و فەرمووی: ((ڕاسترین گوتە وتەی لوبەیدی شاعیرە: ألا كلّ شيءٍ ما خلا الله باطل، وكاد أميّة بن أبي السّلط أن يُسلم)) [بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە لە ئەبو هوڕەیرەوە].

هەروەك صلّى الله عليه وسلّم گوتار بێژێکی دانابوو بۆ بەرگری لە ئیسلام و موسڵمانان کە ئەویش -ثابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەماس بوو- کە مزگێنی بەهەشتی پێدرا بوو،کاتێك بەنو تەمیم هاتن بە گوتاربێژ و شاعیرەکانیانەوە پێغەمبەر صلّى الله عليه وسلّم بە ثابتی کوڕی قەیسی گوت: ((هەڵسە وەڵامی بدەوە))، وەڵامی دایەوە، ئەقرەعی کوڕی حابس هەڵسا و گوتی، بەڕاستی موحەممەد بۆی تەواو دەکات سوێند بە الله، نازانم بۆ ئاوایە وتاربێژمان گوتاری دا



سەنگەری ڕاگەیاندن بەشێکی سەرەکیە لە جیهاد

بەڕاستی وتاربێژی ئەوان باشتری گوت، شاعیرمان قسەی کرد شاعیری ئەوان شاعیرێکی باشتربوو و قسەی جوانتربوو، پاشان نزیك بووەوە لە پێغەمبەر -صلّى الله عليه وسلّم- گوتی: أشهد أن لا إله إلاّ الله وأنّك رسول الله [ئەبو نەعیم لە جابری کوڕی عبدالله گێڕاویەتیەوە لە معرفة الصحابة].

وە دەتوانین کە گرنگترین ئامانجەکانی ڕاگەیاندنی ئیسلامی لە چەند خاڵێك کورت بکەینەوە:

أ. بەرگری کردن لە ئابڕوی موسڵمانان و بیروباوەڕیان، الله تعالى لە مەدحی شاعیرەکان دەفەرموێت: ﴿إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَذَكَرُوا اللَّهَ كَثِيرًا وَانتَصَرُوا مِن بَعْدِ مَا ظُلِمُوا﴾ ئیبن عەباس دەڵێت: «واتە وەڵامی کافران دەدەنەوە کاتێك جوێن بە باوەڕداران دەدەن» [تەبەری گێڕاویەتەوە].

وە ڕەسول الله، صلّى الله عليه وسلّم دەفەرمووێت: ((ئەی حەسان بەرگری لە پێغەمبەر بکە، یا الله یارمەتی بدە بە جوبرائیل)) [بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە لە ئەبو هورەیرەوە].

وە لای ئیبن عەساکر هاتوە کە ڕەسول الله -صلّى الله عليه وسلّم- فەرموویەتی: ((کێ پارێزگاری لە ئابڕوی موسڵمانان دەکات؟ کەعب گوتی من، وە کوڕی ڕەواحە گوتی من و حەسانیش گوتی من، فەرمووی بەڵێ تۆ جوێنیان پێبدە و جوبرائیل یارمەتیت دەدات)) [تاریخ دمشق].

وە صلّى الله عليه وسلّم فەرموویەتی: ((الله پاڵپشتی حەسان دەکات بە جوبرائیل کاتێك بە ئیسلام هەڵدەدات یان بەرگری لە ڕەسول الله صلّى الله عليه وسلّم دەفەرموێت)) [ترمزی گێڕاویەتیەوە لە عائیشەوە].

ب. بەرزکردنەوەی ورەی گەنجەکانی نەتەوە و بەتایبەتی موجاهیدان، لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە کە گوتویەتی دەرچووین لەگەڵ پێغەمبەر سەلامی لەسەر بۆ خەیبەر، بە شەو ڕۆیشتین، پیاوێك بە عامری کوڕی ئەکوەعی گوت: گوێبیستمان ناکەی بە شیعرەکانت؟ گوتی عامر خۆی پیاوێکی شاعیر بوو، دابەزی و باسی گەلەکەی کرد [بوخاری وموسلیم گێڕاویەتیەوە].

ج. ئابڕوبردنی درۆی بیروباوەڕ و ئەخلاقی کافران و موڕتەددان، وە بۆ بەرچاو ڕۆشنی گەلی مسوڵمانان بە ڕاستی زبڵدانی پێشکەوتنیان و پوچی کەلوپەلیان، و کپ کردنەوەی یاخیبوان کە زمان درێژی دەکەن لەسەر موسڵمانان و بڵاوکردنەوەی ترس لە دڵیان، ابن عبدالبر لە الإستعاب لە ابن سیرینەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: شاعیرە موسڵمانەکان حەسانی کوڕی ثابت و عبدالله ی کوڕی ڕەواحە و کەعبی کوڕی مالیك بوون، کەعب لەجەنگ دەیترساندن و عبدالله کوفرەکانی عەیبدار دەکردن و حەسان تانەی لە ڕەچەڵەکیان دەدا، ئیبن سیرین دەڵێت: پێم گەیشتوە کە کۆمەڵێك لە هۆزی دەوس موسڵمان بوون لەسەر قسەی کەعبی کوڕی مالیك کاتێك گوتی:

قضينا من تهامة كلّ وطر ***وخيبر ثمّ أغمدنا السيوفا
نخبرها ولو نطقت لقالت***قواطعهنّ دوساً أو ثقيفا

هۆزی دەوس گوتیان دەرچن با دانەبەزن و وەك ئەقیفتان لێبێت.

د. گواستنەوەی وێنەیەکی ڕاست لەسەر جەنگەکان کە دەستارەکەی دەسوڕێت لە نێوان پاڵەوانەکانی نەتەوە و دوژمنانیان، و پشت ڕاستکردنەوەی پاڵەوانیە ڕاستیەکانی گەنجانی ئیسلام لەترسی ئەوەی بزربێت یان بدزرێت لەلایەن ئەوانەی بازرگانی بە خوێن دەکەن.

# ئاین ئامۆژگاریە

الله تعالی دەفەرمووێت: {تاوان لەسەر ئەوانە نیە کە ناتوانن گەشت بکەن و غەزوە بکەن و ئەوانەی کە نەخۆشن و ئەوانەی کەوا سامانیان نیە کە جیهادی پێبکەن ئەگەر ئامۆژگاریان کرد بۆ الله و ڕەسولەکەی تاوان نیە لە سەر چاکە کاران و الله لێخۆشبووی میهرەبانە}

[التوبة: ٩١].

## پایەکەی

لە جەریری کوڕی عبدالله وە ﷺ فەرموویەتی: "بەیعەتم دا بە ﷺ لەسەر نوێژ و زەکات ئامۆژگاری بۆ هەموو موسڵمانان"

[بوخاری وموسلیم گێڕاویانەتەوە].

## ئامۆژگاری بۆ کێیە؟

لە تەمیمی داریەوە ﷺ کە ﷺ فەرموویەتی: (ئاین ئامۆژگاریە)، گوتیان: "بۆ کێ؟" فەرمووی: (بۆ الله و قورئان و رەسولەکەی و پێشەوای موسڵمانان و موسڵمانان)

[بوخاری وموسلیم گێڕاویانەتەوە].

## راستی ئامۆژگاری

### ئیبن حەجەری عەسقەلانی لە "فتح الباري" دەڵێت:

1

**ئامۆژگاری بۆ الله:** کەسانێك باسیان کردوە کە ئەهلی ئەم کارەن، وە ملکەچن بۆ الله لە ئاشکرا و پەنهانی، وە خۆشویستنی بە کردنی کاری چاکە، وە ترسان لە تورەیی و تاوانکاری، وە جیهاد کردنی ئەوانەی سەرکەشی ئەو دەکەن.

2

**ئامۆژگاری بۆ قورئان:** فێربوون و فێرکردنی خەڵك، و ماف دان بە پیتەکانی، و گەڕان لەماناکانی، و وردبوونەوە لەماناکەی، و پاراستنی سنورەکانی، و کارکردن بە فەرمانەکانی، و دورکەوتنەوە لەوانەی ماناکانی لار دەکەنەوە.

3

**ئامۆژگاری بۆ پێغەمبەر ﷺ:** بە گەورە دانان، و سەرخستنی بە زیندوویی و مردوویی، و زیندوو کردنەوەی ڕێبازەکانی بە فێربوون، و شوێنکەوتنی لە گوفتار وکردار، و خۆشەویستی ئەو و شوێنکەوتوانی.

4

**ئامۆژگاری بۆ پێشەوای موسڵمانان:** یارمەتی دانی لەسەر ئەوەی کە هەڵی گرتووە، و ئاگادارکردنەوەی لەکاتی بێئاگایی، وە ڕاستکردنەوەی لە هەڵە، کۆبوونەوە بۆی، گەڕاندنەوەی ئەو دڵانەی کە لێی زویر بوون؛ وە لە گەورەترین ئامۆژگاری: دەست گرتنیانە لە ستەم؛ وە لە کۆی پێشەواکان: پێشەواکانی ئیجتیهاد، ئەوەش بە بڵاو کردنەوەی زانستەکەیان، بڵاوکردنەوەی چاکەکانیان، گومان بردنی باش پێیان.

5

**ئامۆژگاری بۆ هەموو موسڵمانان:** بەزەیی هاتنەوە پێیان، هەوڵدان بە سودگەیاندن پێیان، فێرکردنیان، لادانی ناخۆشی لەسەریان، ئەوەت پێخۆش بێت بۆیان کە بۆخۆت پێت خۆشە، ئەوەت پێناخۆش بێت کە بۆخۆت پێت ناخۆشە.



# لە ئاکارەکانی زانای خراپ

نوسینی ئەبو حەفصی شامی
الله ڕەحمی پێبکات

لە ڕونکردنەوەی وتارێکی پێشوو بە ناونیشانی «زانا خراپەکان نەفرینیان لێکراوە و توڕەیی الله یان لەسەرە» [وە رگێڕدراوە لە گۆڤاری ڕۆمیە ژمارە یەك] تێگەیشتنی ڕاستەقینە بۆ خاوەن زانستەکان باسکراون وە گرنگترین تایبەتمەندیەکانمان باس کردن کە بەهۆیانەوە دەبن بە پێشەوا بۆ ئاین، وە لەکاتی شیکردنەوەی دا ئەوە باسکرا کە زانا خراپ و گومڕاکان بەهیچ شێوەیەك ناوی زانا وەرناگرن هەرچەندە لەبەر بکەن و پەرتوك دابنێن، وە هەرچەندە هاوار بکەن، بەڵکو ئەوان نمونەیان وەکو جولەکەیە کە فێربوون و پاشان زانستەکەیان شاردەوە و کاریان پێنەکرد بەڵکو بانگەشەیان کرد بۆ گومڕایی، لەبەر زۆری زانا خراپەکان لەم سەردەمە کە ڕاهاتوون لەسەر گومڕاکردنی بەندەکانی الله پێویستە کە باسیان بکەین بۆ ئەوەی حاڵیان بۆ خەڵکی ڕون بکەینەوە.

یەکەم: شاردنەوەی حەق.

لە ئامانجەکانی بڵاوکردنەوەی زانست و ڕۆشنکردنەوی بۆ خەڵکی بریتیە لە هیدایەتدانیان و بردنیانە بۆ بەرژەوەندیان، وە شاردنەوە و بڵاونەکردنەوەی لە گەورەترین حەڕامکراوەکانە، و لە تاوانە گەورەکانە، لەبەر ئەوەیە الله پەیمانی لە خاوەن پەرتوك و خاوەن زانستەکان وەرگرتوە، کە بۆ خەڵك ڕون بکەنەوە و ئەوەی کە پێویستیانە نەیشارنەوە، الله تعالی دەفەرمووێت: {وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُ فَنَبَذُوهُ وَرَاءَ ظُهُورِهِمْ وَاشْتَرَوْا بِهِ ثَمَنًا قَلِيلًا فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُون} [آل عمران: ١٨٧].

زانای خراپ ناپاکە بەرامبەر بەئاینی الله و کافرە بە نیعمەت و بەخششی زانست و هۆکارە بۆ گومڕاکردنی خەڵکی، لەبەر ئەوەیە الله نەفرینی لێکردوون، وە نەفرینی خەڵکی لەسەر داناون؛ لەبەر فێڵکردنیان لە خەڵکی بە شاردنەوەی ڕاستی لێیان، الله تعالی دەفەرمووێت: {إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَىٰ مِن بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ أُولَٰئِكَ يَلْعَنُهُمُ اللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ} [آل عمران: ١٥٩].

وە گەورەترین شت کە زانا خراپەکان شاردویانەتەوە لەخەڵکی، ڕونکردنەوەی حاڵی تاغوتەکان و حوکمی الله یە لەسەریان، کاتێك الله فەرمانی پێکردووین کە دورکەوینەوە لە تاغوتەکان و کوفرکردن پێیان، و ئەوەی کردوە بە ئەصلی تەوحید و باوەڕ، کاتێك خەڵك زاناکانیان بینی بەئاشکرا ماستاو دەکەن بۆ دەسەڵاتدارە تاغوتەکان و بێدەنگ دەبن لە شیرك و خراپەیان، (بەڵکو فتوادەدەن بە جائیز بوونی شیرکیان بە مەبەستی بەرژەوەندی)، زۆربەیان باوەڕ دەهێنن بە تاغوتەکان، و دۆستایەتیان دەکەن، و دەچنە سەر ئاینیان، بەڵکو بون بە سەربازیان، وە هۆکاری ئەم مورتەددیە بریتیە لە شاردنەوەی



یەکێك لە "زاناکانی" تاغوت چاوەڕێی سەربڕینی دەکات

حەق لەلایەن زانا خراپەکان و گۆڕینی حەق بە باتڵ.

ئەوەی سەیری دورگەی عەرەب بکات بەنمونە دەبینێت کە ئال سەلول ناتوانن زۆر لە شیرك و خراپەکانیان ئاشکرا بکەن، ئەم خەڵکانەی کە دوایان کەوتوون و مورتەدد بونەتەوە هەمووی بەهۆی دەستەی گەورە بەکرێگیراوەکان (هيئة كبار العملاء) و ئیبن باز و ئیبن عوثەیمین و فەوزان و ال شێخەکانی سەردەم و هاوشێوەکانیانە... ئەوەش بەهۆی شاردنەوەی حەق لەلایەن ئەوانەوە و ڕون نەکردنەوەی حەقە بۆ خەڵکی، گومڕابوون، و مورتەددبوون، کە بەشی خۆیان وەردەگرن لەم تاوانە کە خەڵك شوێنیان کەوتوە، و گومانیان وابوو کە ئەوان پێشەوا شەرعیەکانیانن!

حوکمی بۆنە تەشریعیەکانی تاغوتەکان و حوکمی دامەزراندنی بنکە بۆ خاچ پەرستان لە شارەکانیان و بەرەواج کردنی ڕیبا (سو) یان شاردەوە لەخەڵکی... زۆربەی خەڵکی هەڵخەڵەتان پێیانەوە، و گومڕابوون و مورتەددبونەوە، و تاوانی ئەم خەڵکەیان کەوتە سەر کە شوێنیان کەوتوون، بێ ئەوەی کە لە تاوانی شوێنکەوتوانیان کەم بکەنەوە.

وە هەمان حاڵەت لە میسر هۆی گومڕابوونی خەڵکی و شوێنکەوتنیان بەدوای حوسنی موبارەك و سیسی شێخی ئەزهەر بوو کە پێی دەڵێن «السلفية»، بەهەمان شێوە هۆکاری بەشداری کردنی خەڵکی لە شیرکی پەرلەمان و هەڵبژاردن بریتی بوو لە تاغوتەکانی ئیخوانە مورتەددەکان و حیزبی گومڕایی (حزب النور)، ئەم نمونانە لە هەموو وڵاتان دەبینین.

دووەم: گۆڕین و لارکردنەوە لە شەرع:

وە لە ئاکارەکانی زانا خراپەکان ئەوان شەرعی الله دەگۆڕن و لاری دەکەنەو -ئەگەر نەیانتوانی بیشارنەوە- بە تەئویلە خراپەکانیان بۆ دەقە شەرعیەکان، و گۆڕینیان لە مانا ڕاستەکەی بۆ مانایەکی پوچ، هەروەك الله تعالى باسی جولەکەکان دەکات: {يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَنْ مَوَاضِعِهِ} [النساء: ٤٦].

پاشان ئەم گۆڕین و تەئویلە پوچانە دەدەنە پاڵ الله، ئەوان مانا ڕاستەکەی دەگۆڕن بۆ مانایەکی پوچ و وا لەخەڵك دەگەیەنن کە ئەوە مەبەستی الله یە، ئەوەش بە لابردنی مانا ڕاستیەکەی، و چەسپاندنی مانایەکی پوچ، پێشینیان جولەکەیە کە ڕاهاتبوون لەسەر گۆڕانکاری لە دەقەکانی الله تعالى، هەروەك دەفەرمووێت: {وَإِنَّ مِنْهُمْ لَفَرِيقًا يَلْوُونَ أَلْسِنَتَهُمْ بِالْكِتَابِ لِتَحْسَبُوهُ مِنَ الْكِتَابِ وَمَا هُوَ مِنَ الْكِتَابِ وَيَقُولُونَ هُوَ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ وَمَا هُوَ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ وَيَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ} [آل عمران: ٧٨].

دەقە شەرعیەکان کە فەرمان بە جیهاد دەکەن زانا خراپەکان ماناکەیان لە جەنگەوە گۆڕی بۆ مانای تر، بۆ ئەوەی خەڵك دورکەوێتەوە لە کوشتاری کافر و مورتەددان، لەسەرەوەی ئەوانەشەوە بیدعەیان کرد لە گۆڕینی مانای جیهاد بۆ مانایەك کە الله بەڵگەی دانەبەزاندوە لەسەری، بەڵکو پێچەوانەی ڕاستی جیهادە، وەك ئەوەی کە پێیان وایە جیهاد بریتیە لە پەیوەندیکردنی خەڵکی بە سوپا تاغوتیەکان، و چون بۆ دیموکراسی شیرکی بۆ ڕکابەرایەتی عەلمانیەکان کە هەردوولا بەڕدار دەبن لە حوکم و دانانی یاسا، و جگە لەوانەش لەو کارانەی کە مرۆڤ پێی مورتەدد دەبێتەوە کە ئەو نەفرەت لێکراوانە دەیانەوێت ئەو شتانە بلکێنن بە لوتکەی هەرە بەرزی ئیسلام.

بەهەمان شێوە دەقە شەرعیەکان دەگۆڕن کە فەرمانی بە ئاشکراکردنی حەق کردوە، زانا خراپەکان هەوڵی پەکخستنی دەدەن و کاری پێناکەن پێیان وایە کە الله فەرمانی کردوە بە ئاشکرا نەکردنی حەق! ئەم ئایەتە دەکەن بە بەڵگە: {وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ} [البقرة: ١٩٥].

لەکاتێکدا کە مەبەست لە تەهلوکە و لەناوچون بریتیە لە وازهێنان لە جیهاد، هەروەك هاوەڵی بەڕێز ابو ایوب ئەنصاری -الله لێی ڕازی بێت- ڕونی کردۆتەوە کاتێك گوتی: «فالإلقاء بالأيدي إلى التهلكة: بريتیە لەوەی بیرمان لای سامان و بەرژەوەندیمان بیت و واز لە جیهاد بهێنین » [أبو داود گێڕاویەتیەوە].

پیستر نیە لە زانای خراپ و داپۆشینەکانیان لەسەر حەق!

سێیەم: ڕێگرتن لەڕێگای الله:

زانای خراپ بە گرتنی ڕێگای گومڕایی و خراپە زۆر سورن لەسەر ڕێگرتن لە حەق، کاتێك دەترسن کە کردارەکانیان گوتەکانیان بەدرۆبخەنەوە کاتێك کە ڕاستی بۆ خەڵکی ڕون دەبێتەوە بێ گۆڕین و درۆ، هەوڵی لارکردنەوەی دەدەن بۆ ئەوەی فەرمانەکە لەگەڵ ئارەزوی خۆیان بگونجێت، بۆیە دەبینی کە ڕێگری جیهاد لە گەنجەکان دەکەن لەبەر ئەوەی خۆی ڕۆچووە لە دونیا و توشی بەڵای دانیشتن بوە، وە لەبەر ئەوە دەترسێت حەق بڵێت دەبینی کەوا حەق دەگۆڕێت بە ناحەق وە ئەوە دەکات بە بنەڕەتی بانگەوازی؛ وە خۆی وادەردەخات کە ئەو هەر خۆی دانا و زانایە.

ئەوانە حەق بێژ نەبوونە، وە نەشیان شاردۆتەوە بەس، بەڵکو گۆڕیویانە، فێڵیان کردوە و درۆیان کردوە لەسەری، قسەیان لەسەر

الله کردوه بێ زانست بۆ ئەوەی ڕێگر بن لە ڕێگای الله هەروەك چۆن ئەحبار و ڕوهبانەکان کردویانە، الله تعالی دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ كَثِيرًا مِنَ الْأَحْبَارِ وَالرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَالَ النَّاسِ بِالْبَاطِلِ وَيَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلَا يُنْفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ} [التوبة: ٣٤].

چوارەم: خۆشویستنی زۆر بۆ دونیا

ئەم زانا خراپانە پەنایان نەبردوە بۆ شاردنەوەی حەق و گۆڕینی تەنها لەبەر خۆشەویستنی دونیا نەبێت، کەس پەیوەست ناکەن و ڕێگری لەکەس ناکەن لەسەر نیفاق و درۆ و کوفر، بەڵکو سوربونیانە لەسەر کاریان لای تاغوتەکان و موچەی زۆر، وە هەندێکیان سوربوون لەسەر خۆ دەرخستن و نزیك بوونەوە لە تاغوتەکان هاندەریانە، وە هەندێکیان هەڵخەڵەتاون بە دەرچوونیان لەسەر شاشەکان و ئەوەی کە پێی دەدەن! خۆبەگەورەزانین و ناوبانگ حەق بێژی قورس کردوە لەسەریان، پێداگریان کرد لەسەر شاردنەوەی ئەوەی کە الله دایبەزاندوە -ئەو شتانەی کە تاغوتەکان نایانەوێت ئاشکرا بکرێن- لەبەرامبەر بەهایەکی کەم، وە الله تعالی دەفەرمووێت: {إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنَ الْكِتَابِ وَيَشْتَرُونَ بِهِ ثَمَنًا قَلِيلًا أُولَئِكَ مَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ إِلَّا النَّارَ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ} [البقرة: ١٧٤].

وە دەفەرموێت: {وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُ فَنَبَذُوهُ وَرَاءَ ظُهُورِهِمْ وَاشْتَرَوْا بِهِ ثَمَنًا قَلِيلًا فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ} [آل عمران: ١٨٧].

وە ئیبن و قەیم دەفەرموێت: «هەرکەسێك لە ئەهلی زانست کاریگەر بوو بە دونیا و هاوڕێیەتی کرد پێویستە کە شتانێك بڵێت لەسەر الله بە پێچەوانەی حەق « [الفوائد].

پێنجەم: کاریگەربوون بە ترساندن و هەڕەشەکردن و لادان لە حەق بەهۆیەوە

ئەوە بەهەمان شێوە لە ئاکاری زانا خراپەکانە: گەڕانەوە لە حەق دوای دڵنیابوون لێی و نیشاندانی پوچی وەك ملکەچ بوون بۆ ئارەزوەکانی تاغوتەکان بۆ ئەوەی دونیایان پێبدەن، چ ستەمێك لەوە گەورەترە! و چ ناپاکیەك لەوە توندترە!

هەروەك لە چیرۆکی بەلعامی کوڕی باعورا داهاتووە کە پیاوێك بوو لە شاری جەبارین، ئەگەر زانا خراپەکانی ئەم سەردەمە کۆبکەیتەوە زانستەکەیان ناگات بە یەك بەش لە دەبەشی زانستی بەلعام، کاتێك ئیبن عەباس -الله لێی ڕازی بێ- گوتی: «بەلعام ناوی گەورەی الله ی دەزانی» [تفسير ابن أبي حاتم].

وەك ئاماژەیەك بۆ بەرزی پلەکەی لە زانست، وە هەندێك لە پێشین گوتویانە: «کە دوعای گیرابووە، و لەکاتی ناخۆشی ئەویان بە پێش خۆیان دەدا، وە لە زاناکانی نەوەی ئیسرائیل بوو» [رواه ابن أبي حاتم عن مالك بن دينار].

وە لەگەڵ ئەوە کاتێك لای دا لە ڕێباز، و لای دا لە حەق، بەسەگ چوێندرا!

وە کاتێك موسا سەلامی لەسەر دابەزی بۆ جەبارین، گەلەکە هاتن بۆ لای بەلعامی ئامۆزای موسا و گوتیان: «بەڕاستی موسا پیاوێکی نوێیە، و سەربازێکی زۆری لەگەڵە، وە ئەگەر سەرکەوت بەسەرمان لەناومان دەبات، داوا لە الله بکە کە موسا و ئەوانەی کە لەگەڵین لێمانیان دوربخاتەوە»: گوتی: «ئەگەر من دوعام لە موسا و ئەوانەی کە لەگەڵیەتی کرد ئەوە دونیا و دوارۆژم دەڕوا»، بەردەوام ماوە تا دوعای لێکردن، هەڵگەڕاوە لەسەر ئەوەی کە لەسەری بوو [رواه ابن أبي حاتم عن ابن عباس].

الله تعالی دەفەرموێت: {وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ الَّذِي آتَيْنَاهُ آيَاتِنَا فَانْسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ الشَّيْطَانُ فَكَانَ مِنَ الْغَاوِينَ * وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَاهُ بِهَا وَلَكِنَّهُ أَخْلَدَ إِلَى الْأَرْضِ وَاتَّبَعَ هَوَاهُ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ الْكَلْبِ إِنْ تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَثْ} [الأعراف: ١٧٥-١٧٦].

وە مالك کوڕی دینار گوتویەتی: «موسا بەلعامی نارد بۆ پادشای مەدیەن بۆ ئەوەی بانگەوازی بکات بۆلای الله، ئەو بڕێك پارەی بۆ بڕیەوە، و بەلعام شوێن ئاینی ئەو کەوت و وازی لە ئاینی موسا هێنا بۆیە ئەم ئایەتە دابەزی» [تفسير ابن أبي حاتم].

بەلعام {أَخْلَدَ إِلَى الْأَرْضِ وَاتَّبَعَ هَوَاهُ}، ڕوی کرد لە دونیا و خۆشیەکانی، و پشتی کرد لە ئایەتەکانی الله، تا زاڵ بوو لەسەری وەك سەگێك زمانی بەدەرەوە بێت بەبەردەوامی.

لە موجاهیدەوە گوتویەتی: «نمونەی ئەوەی کە پەرتوك دەخوێنێت و کاری پێناکات» [تفسير الطبري].

وە قورتوبی دەڵێت: «وە ئەوە نمونەیەکە لەسەر ووتەی زۆربەی ئەهلی زانستی تەئویل بۆ ئەوانەی کە قورئانیان پێدراوە و کاری پێناکەن» [تفسير القرطبي]، نمونەیان زۆرە لەم سەردەمەدا.

کۆتایی:

ئەوە هەندێکە لە ئاکارەکانی زانا خراپەکان کە الله ڕونی کردۆتەوە و ئابڕوی بردوون، وە باسی کردوون تا بەندەکانی لێیان دورکەونەوە، و گوێیان بۆ نەگرن، و لێیان وەرنەگرن، وە دەبینین کە الله باسی ئاکارەکانیانی کردون و ناوی نەهێناون بە زانا لەگەڵ ئەوەی کە شارەزا بوون بە حوکمەکانی الله، بەڵام کاتێك کە ترسیان نەما لە الله، و وازیان هێنا لە کردار بەوەی کە دەیانزانی، زانستەکەیان سودی پێنەگەیاندن، بەڵکو هۆکارێك بو بۆ نەفرین لێکردنیان لە دونیا و دوارۆژ، وە باسکردنیان بە خراپترین باس، و چوونیان بۆ دۆزەخ، بەڵکو الله شوێنکەوتوەکانی ئەحبار و ڕوهبانەکان -کە پێشینەی زانا خراپەکان و ئەوانەن کە لایان داوە لە ئاینیان- و گوێڕایەڵیان لە کوفرەکانیانیان بە شیرکی گەورەیان داناوە و لە ئاین دەریان دەکات، هەروەك الله فەرموویەتی: {اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا إِلَٰهًا وَاحِدًا لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ} [التوبة: ٣١].

هیچ کەسێك بیانوی نیە بەکوفرکردنی بە شوێنکەوتن و لاسایی کردنەوەی زاناکانی تاغوت، بەڵکو لەسەر هەموو مرۆڤێك واجبە کە هەوڵبدات بۆ حەق و کرداری پێبکات، والحمد لله رب العالمين.

# حەرامبوونی بیدعە

## فەرمان کردن بە دورکەوتنەوە لێی

**الله تعالی دەفەرموێت:**

**{لەمەودوا ئێمە تۆمان خستۆتە سەر بەرنامەیەکی ڕون کەواتە شوێنی بکەوە و شوێنی ئارەزوی نەزانان مەکەوە}** [الجاثية: ١٨]

**الله تعالی دەفەرموێت:**

**{ئەی پەروەردگار باوەڕمان هێنا بەوەی دات بەزاندوە و شوێنکەوتەی پێغەمبەرەکەشتین تۆش لەوانەمان بنوسەکە ئاینەکەیان گەیاندوە}** [آل عمران: ٥٣]

ئیبن تەیمیە گوتی ﵀: "بەندایەتی کردن دامەزراوە لەسەر شەرع و شەوێنکەوتن نەوەك ئارەزو و بیدعە، بەڕاستی ئیسلام لەسەر دوو بنەما دامەزاروە: یەکەمیان: تەنیا الله بپەرستین و هاوبەشی بۆ بڕیارنەدەین، دووەم: بەم جۆرە پەرستشی بکەین کە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ هاتوە و شوێنکەوتەی ئارەز و بیدعە نەبین، کەس بۆی نیە الله بپەرستێت مەگەر لەوەی کە لەلایەن ڕێگای پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە لە واجب و سوننەت".

[مجموع الفتاوی]

**ڕەسول الله ﷺ فەرمویەتی:**

**(خراپترینی فەرمانەکان داهێنراوەکانە، وە هەموو داهێنراوێك گومڕاییە)**

[رواه البخاري ومسلم]

ئیبن تەیمیە گوتی ﵀: "هەرکەسێك لەخۆیەوە شتێك بکات بە ئاین و هۆی نزیك بونەوە لە الله بێ ئەوەی ڕاوا بێت لای الله ئەوە بیدعەچیەکی گومڕایە، ئەوەیەکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (هەموو داهێنراوێك گومراییە)، داهێنان دژی شەرعە، شەرع ئەوەي کە الله و ڕەسولەکەی فەرمانیان پێکردوە بە واجب بوون یان سوننەت بون، هەرچەندە نەکراپێت لەسەر دەمی خۆی وەك تەراویح لە دوای ئیمامێك، و کۆکردنەوەی قورئان لە پەرتوکێك، و کوشتنی ئەهلی ڕیدە و خەواریج و لەم شێوانە، ئەوەی الله وڕەسولەکەی دایان نەناوە ئەوە بیدعەیەکی گومڕاییە"

[مجموع الفتاوی]

**ڕەسول الله ﷺ فەرمویەتی:**

**(ئەوەی کارێك بکات و لەسەر فەرمانی ئێمە نەبێت ئەوە ڕەت دەکرێتەوە)**

[رواه مسلم]

کوری شاهین و لالەکائی گێڕاویانەتەوە لە سەعدی کوری جوبەیر ﵀ گوتی: گوتە بێ کردار وەرناگیرێت، وە کردار وەرناگیرێت بێ گوتە، وە گوتە و کردار وەرناگیرێت بێ نیەت، وە گوتە و کردار و نیەت وەرناگیرێت ئەگەر وەك سوننەت نەبێت" [رواه اللالكائي]، ئیبن تەیمیە گوتی ﵀: "ئەوە [واتە سوننەت] شەریعەت، ئەوەیە کە الله وڕەسولەکەی فەرمانیان پێکردوە، لەبەر ئەوەی گوتە و کردارو نیەت ئەگەر سوننەت نەبێت هەروەك چۆن الله فەرمانی پێکردوە ئەوە بیدعەیە، ئەوە نیە کە الله پێی ڕازیە، و بە چاکی داناوە"

[مجموع الفتاوی]

# ژیاننامەی هەندێك لە پێشەواكانی

# موڕابیتون

عبد اللە كوڕی یاسین
نوێكەرەوەی شەریعەت لە خاكی بیابان

لە ڕێبازەكانی اللە -عز وجل- لە دروستكراوەكانی هەركاتێك ئەوان كەوتنە ناو گومڕایی و خراپە كەسێكیان بۆ دەنێرێت كە فەرمانی ئاینەكەیان بۆ نوێ بكاتەوە، كۆمەڵێك لە خەڵكی دوای دەكەون و زۆربەی پشتی لێدەكەن و لەسەر گومڕایی دەمێننەوە، وە موەحیدەكان حاشا لەوانە دەكەن كە پێچەوانەی ڕێبازی اللە دەردەخەن و بەشمشێر لێیان دەدەن تا ئاینی اللە زاڵ دەبێت و ئاین هەمووی بۆ اللە دەبێت، لەوانە بانگخوازی زانای موجاهید عبداللە كوڕی یاسینە، ڕەحمەتی اللە ی لێبێت.

چیرۆكەكەی دەست پێدەكات بە بڕیارێك لەلایەن شێخی هۆزەكەی كدالة القاطنة لە بیابانی مەغریب یەحیای كوڕی ئیبراهیم، كە ئەوبوو گەلەكەی ناساند بە شەریعەتی اللە و سنورەكانی، كە پیاوێكی چاك بوو و ئاینی خۆش دەویست، بەردەوام بوو لە گەڕان لەدوای ئەوانەی كە لەگەڵی دەردەچوون بۆ بانگخوازی گەلەكەی، زۆر لە بانگخوازەكان دەرچونیان بۆ بیابان ڕەت كردەوە لەبەر قورسی ڕێگاكە، جگە لە بانگخواز عبداللە كوڕی یاسین، ئەو ئەم كارەی قەبوڵ كرد و پشتی بەستا بە اللە.

السلاوي گوتی: «پیاوێك خۆی بۆ ئەم ڕێگایە ئامادەكرد ناوی عبداللە كوڕی یاسین الجزولي بوو، لە زمان پاراوترین قوتابیەكان بوو وە خاوەنی فەزڵ و ئاین و وەرع و سیاسەت بوو، بەشدار بوو لە زانستەكان، دەرچوو بۆ بیابان لەگەڵ یەحیای كوڕی ئیبراهیم»، بەم شێوەیە كوڕی یاسین بەرگەی نامۆیی و ڕێگای بیابانی گرت بۆ ئەوەی ئاین هەڵگرێت بەكۆڵیەوە بۆ گەلێك كە ئاینیان لێ ونبوە.

كاتێك عبد اللە كوڕی یاسین گەیشتە مضارب، هۆزی مەتونە پرسیاریان لێكرد كە بۆچی هاتوە، باسی شەریعەتی ئیسلامی بۆكردن و فێری كردن و سنورەكانی پێڕاگەیاندن، ئیبن ئەثیر گوتی: «وە گوتیان: باسی شەریعەتی ئیسلاممان بۆ بكە، فێری بیروباوەڕی ئیسلام و واجبەكانی كردن، گوتیان: ئەوەی باست كرد لە نوێژ و زەكات، ئەوە نزیكە و كێشەی نیە، بەڵام ئەوەی كە دەڵێی: ئەوەی بكوژێ دەكوژرێ، ئەوەی دزی بكات دەستی دەبڕێت، و ئەوەی زینا بكات جەلد دەكرێت یاخود ڕەجم دەكرێت، فەرمانێكە پێویستمان پێی نیە، بڕۆ بۆ لای كەسانێكی تر! ئەوانیش ڕۆیشتن»، بەم شێوەیە ئەم هۆزە مورتەددە هەر لەسەرەتاوە ڕێگربوون لە پەیوەست بوون بەشەریعەتی ئیسلامی، كوڕی یاسین ئامادە نەبوو بمێنێتەوە لە ناویان كە ئەوان پەیوەست نەبن بە تەواوی ئاین.

كوڕی یاسین چوو بۆ لای هۆزی كدالة بە هاوڕێیەتی لەگەڵ شێخەكەی، ئیبن ئەثیر گوتی: «كوڕی یاسین بانگەوازی هۆزەكانی تری دەوروبەری كردن بۆ حوكمی شەریعەت، هەیان بوو وەڵامی داوە، و هەیان بوو پشتی هەڵكرد»، پاشان ناچار بوو كە دەرچێت لەبەر ئەوەی حوكمی شەریعەتیان پێناخۆش بوو ملكەچ نەبوون بۆی، ئەو كات كە كوڕی یاسین هێزێكی نەبوو بۆ جەنگیان ویستی بڕوات بۆ سودان بۆ بانگەواز كردنیان، بەڵام شێخی هۆزی كدالة ئاماژەی



دورگەیەکی ڕوباری کە دەگوترێت موڕابیتون لێرەوە سەریان هەڵداوە

پێدا کە بمێنێتەوە لە قوتابخانەیەکی بەناوبانگ (دەگوترێت نزیکە لە ڕوباری سەنیگال). ئیبن خەلدون گوتی: «پشتی کردە خەڵکی و ماوە لەشوێنێك لە نزیك دەریای نیل لەلایەك کە لە هاوین ئاوێکی کەمی لێبوو لە زستانیش زۆر، خوی گرت و ڕاهات لەکەناری دەریا، چوون بۆ ناو دارستان و مانەوە بەتەنیایی بۆ بەندایەتی اللە».

لە بانگخوازیەوە بۆ جیهاد

اللە ویستی وابوو کە ئەم بانگخوازە ببێت بە بناغەیەکی چاك بۆ دامەزراندنی ئیمارەتێکی ئیسلامی، ئیبن خەلدون گوتی: «ئەوەی کە چورە ئیمانێکی لەدڵ دابوو وەڵامی بانگخوازەیەکەی دانەوە و هاتە ناو ئاین و بەشداربوو لەگەڵیان، کاتێك ژمارەیان بوو بە هەزار پیاو، شێخەکەیان عبداللە کوڕی یاسین گوتی: هەزار نادۆڕێت لەبەر کەمی، بەڕاستی ئێستا ئاشکراکردنی حەق و بانگەوازکردن بۆی فەرزی عەینە، ئێمە دەرچووین بۆ ئەمە، دەرچن ئەوەی وەڵامی نەدانەوە لە هۆزی لمتونة و کدالة بیکوژن»، کوڕی یاسین دەرچوو بۆ جیهاد لەڕێی اللە دژی هۆزە موڕتەددەکانی ڕێگر لە جێبەجێکردنی شەریعەتی اللە.

وە ئیبن ئەثیر دەیگێڕێتەوە و دەڵێت: «کوڕی یاسین ئەوانەی کە گوێڕایەڵی بوون پێی گوتن: واجبە لەسەرتان جەنگی ئەوانە بکەن کە پێچەوانەی حەق دەجوڵێنەوە، خۆتان ئامادەبکەن بۆ جەنگ، ئاڵایەك دابنێن، و فەرماندەیەکی بۆ پێشنیار کردن»، وە بەم کۆمەڵە باوەڕدارە کەمە بوون بە سەنگەرنشین لە بیابان لە پێناو حوکمی اللە تعالی، سەلاوی گوتی: «غەزوەی هۆزەکانی دەکرد تا هەموو خاکی بیابانی کۆنترۆڵ کرد و هۆزەکانی ڕیسوا کرد... فەرمانەکەی بڵاوبویەوە لە هەموو خاکی بیابان لەگەڵ ئەوانەش کە دۆستایەتیان کرد لە سودان و القبلة و المصامدة و هەموو خاکی مەغریب، وە هەڵسا بە دانانی پیاوێك لە هۆزی کدالة بانگەوازی خەڵکی دەکرد بۆ ڕێگای ڕاست و حوکمی بە دابەزێنراوەکان کرد لەلایەن اللە وە، وە کەسێکی خۆبەکەم زان و پشت کردوو بوو لە دونیا، ناوی دەرکرد لە جیهان و ڕێز و فەزڵی ئاشکرا بوو بۆ خەڵکی و چوە ناو دڵی خەڵکی»، کاتێك لەسەرەتای فەرمانەکە خەڵکی تورە کرد لە خۆی لەبەر ڕەزامەندی اللە، اللە خەڵکی وا لێکرد کە ڕازی بن لێی، و خۆشیان بوێت و بچنە ژێر فەرمانەکانی.

فەرمانڕەوای کردن بەشەریعەت

کاتێك شێخی کدالة کۆچی دوایی کرد کوڕی یاسین فەرماندەیەکی لە هۆزی لمتونة دانا بۆ سەرکردایەتی سەربازی، سەلاوی گوتی: «عبداللە کوڕی یاسین سەرکردەی هۆزەکانی لە صنهاجة کۆکردەوە و یەحیای کوڕی عومەری لمتونی و عبد اللە کوڕی یاسین بوون بە فەرماندە... یەحیا بوو بە سەرکردەی جەنگی، و عبداللە کوڕی یاسینیش بوو بە بەرپرسی فەرمانی ئاین و حوکمەکانی شەرع و زەکات و ئەعشاری لێوەردەگرتن».

موڕابیتون بەردەوام بوون لەدوای فەرماندە سەربازیە نوێیەکەیان کە ئەویش لەژێر فەرمانی عبداللە کوڕی یاسین بوو کە ئاینیان بۆ خەڵك نوێ دەکردەوە.

لە ساڵی (٤٤٦ ك) -هەروەك بەکری باسی دەکات- کوڕی یاسین غەزوەی کرد بۆ سەر أودغست (باشوری مۆریتانیای ئەمڕۆ) کە پێشتر ماڵی پاشای غانا بوو پێش ئەوەی ببێت بە موسڵمان، بەکری گوتی: «کە تێیدا عبداللە کوڕی یاسین پیاوێکی کوشت لە عەرەب کە لە ئەهلی قەیرەوان بوو کە ناسرابوو بە وەرع و چاکساز و قورئان خوێندن و حەج کردن کە پێیان دەگوت زباقرة، بەڵام کوشتی چونکە لەژێر فەرمانی خاوەنی غانای [بتپەرستی] وحوکمەکەی بوو» [المسالك والممالك].

وە لە ساڵی (٤٤٧ ك) مرابیتون چوونە ناو سجلماسة (باشوری مەغریبی ئەمڕۆ) هەرچی ستەمکاری هەبوو نەیانهێشت، سەلاوی گوتی: «هەرچی خراپەکاری هەبوو گۆڕیان، مۆسیقا و ئامێرەکانیان پارچە پارچە کرد، و ئەم شوێنەی کە ئارەقی تێدا دەفرۆشرا سوتاندیان، مەکس (پارەیەکە کە لەبازاڕ وەردەگیرا لە سەردەمی نەزانی) و گومرگیان نەهێشت، ئەوەی کە قورئان و سوننەت واجبیان کردبوو کە نەمێنن نەیانهێشت، پیاوێکی لە هۆزی لمتونة کرد بەسەرکردەی

سجلماسة و خۆشی ڕوی کردە بیابان».

وە لە کۆتایی ساڵی (٤٤٧ ک) فەرماندە یەحیای کوڕی عومەری لمتونی کوژرا شێخ کوڕی یاسین براکەی (أبا بکر کوڕی عمر) دانا لە جێگاکەی لە ساڵی (٤٤٨ ک)، ئەویش لە ژێر فەرمانی شارەزا کوڕی یاسین دابوو وەك براکەی، بەردەوام بوون لە جیهاد لەڕێی الله، سەلاوی گوتی: «موڕابیتون چونە ناو شاری أغمات [ڕۆژهەڵاتی مەغریب] ساڵی چوارسەد و چل و نۆ، عبداللە کوڕی یاسین لەوێ مایەوە بۆ ماوەی دوو مانگ تا سەربازەکانی حەوانەوە، پاشان دەرچوو بۆ تادلا و فەتحی کرد و هەرچی سەرکردە هەبوو کوشتیان لە بەنی یفرن و دەستیان گەیشت بە بلقوط المغراوی و کوشتیان... پاشان عبداللە کوڕی یاسین چوو بۆ تامسنا و فەتحی کرد و دەستی گرت بەسەری».

وە عبداللە کوڕی یاسین -بەڕەحمەتی الله بێت زیانێکی گەورەی لەموڕتەددان دا لە کوشتن و سەبیەکردن تا کەسێکی نەزان بەحاڵی موجاهیدان هەواڵەکەی گەیاند بە شێخەکەی، زەهەبی گوتی: «ئەوەی عبداللە کوڕی یاسین کردی بەموڕتەددان هەواڵەکەی گەیشت بە شێخەکەی ئەوەی لا گەورەبوو، نامەیەکی بۆنارد و تێیدا ئینکاری زۆرکوشتن و سەبیەکردنی لێکرد، ئەویش وەڵامی داوە: هەرچی ئینکاری کردنتە لەسەرم لەبەر ئەوەی کە کردم وە پەشیمانیش بۆ تۆ لەسەر ئەوەی کە ناردوتە، تۆ ناردمت بۆ نەتەوەیەك کە نەزان بوون، یەکێکیان کوڕەکەی و کچەکەی دەنارد بۆ شوانی ئاژەڵەکانی، کچەکەی دەهاتەوە و سکی پڕبوو لە براکەی، و ئەوەیان پێ ئاسایی بوو، هیچ شتێك نەبوە هۆی ئەوەی کە ڕابێن لەسەر ئەمە جگە لە بێغیرەتی نەبێت لەسەر یەکتری، و هەندێك هەندێکیان دەکوشت، هەرچی کردیان کردیان و سنورەکانی الله و ئیسلامیان بەزاند» [تاریخ الإسلام]، بەم شێوەیە کوڕی یاسین وەڵامی کەسێکی داوە کە دور بوو لە ڕوداوەکە و باوەڕی بەوە کردبوو کە خەڵك بۆیان باس کردبوو.

دوای ئەم فتوحاتانە مرابیتون ڕویان کردە غەزوەی هۆزی (برغواطة)ی موڕتەدد بەفەرمانی شێخ و فەقیهیان، سەلاوی دەڵێت: «وە گوتراوە کە براغوطة هۆزێکی زۆربوون گەمژایەتی زۆریان هەبوو لەسەرەتای فەرمانەکەیان کۆبونەوە لەسەر صالح طریف المتنبئ درۆزن، و بەردەوام بوون لەسەر ئەم حاڵەتە گومڕایی و کوفریە تاوەکو ئێستا، کاتێك عبداللە کوڕی یاسین حاڵی ئەم هۆزەی بیست کەلەسەر کوفرن بەواجبی زانی کەوا جیهادی ئەوان پێش هەموو شوێنەکانی تر بخات و سوپای موڕابیتینی بۆ ناردن»، قەدەری الله وا دەبێت کە عبداللە کوڕی یاسین لەم داستانە بریندارببێت و پلەی شەهادەت بەدەست بهێنێت لە بەرامبەر ئەم کافرانە لە ساڵی (٤٥١ ک) خاوەنی پەرتووکی «الاغتباط» لەبارەیەوە دەڵێت: «مەغریب ملی کەچ کرد تاوای لێهات فێری زانستەکانی ئیسلام دەبوو کە خەریك بوو لەسەرەتاوە لێی بێبەش بێت».

وەسیەتی کوڕی یاسین

سەلاوی دەڵێت: «کاتێك لەسەرە مەرگی دابوو گوتی: ئەی موڕابیتین، من ئەمرۆ دەمرم وە ئێوە لە خاکی دوژمنتان دان، نەکەن ترسنۆك بن و ناکۆکی بکەن تا لاواز بن و هێزتان بڕوات وە یارمەتی یەکتر بدەن لەسەر حەق و برابن لەپێناو الله، نەکەن ئێرەیی بەیەکتر ببەن لەسەر سەرۆکایەتی بەڕاستی الله ئەوەی بیەوێت پێی دەدات وە کەسانێك دەکات بە جێنشینی لەسەر زەوی لەبەندەکانی بە ئارەزوی خۆی».

کوڕی یاسین ڕۆیشت دوای ئەوەی کەوا بناغەی ئیمارەتی ئیسلامی دامەزراند کە لە ڕوباری سەنیگالەوە دەستی پێدەکرد لە باشورەوە تا دەگەیشتە نزیك مەغریب لە باکور، پاشان گەشەی سەند تا گەیشتە ئەندەلوس لەسەر سنوری فەڕەنسا لای باکوری ئەوەش لەسەر دەستی قوتابیەکەی یوسف کوڕی تاشفین، پاشان بۆ جەرگەی جەنگەڵەکانی ئەفریقیا لەباشور لەسەر دەستی قوتابیەکەی ئەبو بەکری کوڕی عومەر، ڕۆیشت دوای ئەوەی کەوا نەوەیەکی لە موجاهیدان جێهێشت بۆ تەواوکردنی ڕێگاکەی، دوای ئەوەی شەریعەتی ئیسلامی لەناو جێبەجێکردن، الله ڕەحم بە کوڕی یاسین بکات، وە الله بەرەکەت بکاتە سەربازانی خیلافەتی ئەمڕۆ ئەوانەی کەوا خەریکی داپڵۆسینی موڕتەددانی ڕێگرن لە جێبەجێکردنی شەریعەتی الله،وە ئەوەوە واز لێناهێنن هەرچەندە قوربانی زۆر بووێت تا ئاین هەمووی بۆ الله بێت.

ئەبو بەکر لمتونی

فەرماندەی بڵاوکردنەوەی ئیسلام لە سودان

لە بەشی پێشوو کەمێك باسی ژیانی نوێکەرەوە عبداللە کوڕی یاسینمان کرد لەدامەزراندنی ئیمارەتێك بۆ موڕابیتە موجاهیدەکان، ئەم پیاوە کە فەزڵی هەبوو لەسەر دامەزراندنی نەوەیەك بۆ هەڵگرتنی ئاڵا دوای خۆی، لەوانە یوسفی کوڕی تاشفین کە ڕوی سوپای موسڵمانانی کردە ئەندەلوس لای باکوریەوە و سەرکەوت بەسەر خاچ پەرستان، وە لەوانە سەرکردە ئەبوبەکری کوڕی عومەر کە لمی بیابانی بڕی و ئەرکی هەڵگرتنی ئیسلام و حوکمی شەریعەتی خستبوە سەر شانی بۆ ئەفریقیا.

ئەوەی مێژووی ئەم پیاوە جیادەکاتەوە بریتیە لە قوربانی دان بەهەموو شتێك بۆ خزمەتکردنی ئاین و نەتەوەکەی، پێداگربوو لەسەر یەکڕیزی و شکۆمەندیان، کوڕی عومەر هەڵنەستا بۆ خزمەتکردنی خۆی و بەرژەوەندیەکانی لەسەر حیسابی نەتەوەکەی و یەکڕیزی، هەروەك زۆر لەوانەی خۆیان پاڵداوە بۆ ئەم نەتەوەیە لە پێشوو و ئێستاشدا.

سەرکردەی سەربازی نوێ

ژیانی کوڕی لمتونە دەستی پێکرد بە زانستخوازی لەسەر دەستی کوڕی یاسین پاشان بۆ سەرکردەی سەربازی سوپاکەی، لە موحەڕڕەمی ساڵی (٤٤٨ ک) ئەبو بەکری کوڕی عومەر بوو بە سەرکردەی سەربازی موڕابیتین لەدوای براکەی یەحیای کوڕی عومەر، وەبەردەوام بوو لە ژیانی جیهادی لەژێر فەرمانی و سەرپەرشتی شارەزا کوڕی یاسین.

غەزوەی ڕافیزەی البجلیة

وە لەهەمان ساڵدا لە (٤٤٨ ک) ئەبو بەکری کوڕی عومەر غەزوەی سوسی کرد، و لە ساڵی (٤٤٩ ک)هەریەکە لە ماسة و تارودانت فەتحکران، کە ئەم شارانە لە لانەکانی ڕافیزە بوو لە مەغریب، سەلاوی لە الاستقصا گوتی: «گەلێ ڕافیزەیان لەناو دابوو کە پێیان دەگوترا البجلیة، لەسەر ڕەچەڵەکی علی کوڕی عبداللە البجلي ڕافیزی... عبداللە کوڕی یاسین و ئەبوبەکری کوڕی عومەر جەنگیان کردن تا فەتحی شاری (تارودانت عنوة)یان کرد، و زۆریان لێکوشتن، ئەوەی کەماوە گەڕاوە بۆ ناو ڕێبازی سونەت و جەماعەت».

